# سەرپێچی خوا

## وەك بزوێنەرێك بەرەو

# بەڵاو بەدبەختی

نووسینی

مامۆستا موسلیمی رزگاری

# سەرپێچی خوا

# وەك بزوێنەرێك بەرەو

# بەڵاو بەدبەختی[1]

**نووسینی**

**مامۆستا موسلیمی رزگاری**

---

١ – ئەم زنجیرەیە بریتییە لە رۆشن كردنەوەی كۆششێك بۆ رەنجاندنی نەفس ورازیكردنی خوای پەروەردگار... پشت بە خوا بە ووردی رووناكی دەخەینە سەر خاڵە زۆر گرنگەكان كە بێگوان ئەوەش بەشێكی زۆر گرنگی داپۆشیوە لە تەزكیەی نەفس دڵناسی، خوای پەروەردگار بیكاتە ئومێدی سەربەرزی وسەركەوتن لە دونیا پاشانیش لە دوای مردن .

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمدلله رب العالمين والعاقبه للمتقين و لا عدوان إلا على الظالمين والصلاة والسلام على رسول الله وعلى آله وصحبه ومن والاه.

# کردەوە لە نێوان ئاوماڵەیی[٢] وباشترین ئومێد

کردەوەکانت ئاوماڵەیە یان دەبێتە پاڵپشتی وباشترین هاوڕێ: دەبێ بزانی کردەوەکانت ئەگەر هاوڕێ بێ لەگەڵ تاوان ودڵێکی نووستوو وبێ ئاگا ئەوە وەك ئەو چیلکە وچاڵەی لافاوە وایە کە هاوردویە وداویەتیە کەنار. خۆ ئەگەر دوور بوو لەمە پاڵپشت بە خوا دەبێتە باشترین ئومێد وشانازی لە ساتی کێشانی کردەوە لە تای تەرازووی چاکەکان. ئەمەش بە هەڵگۆزینی دڵ بە نێو بارانی تەوبە وپەشیمانی وئاخ هەڵکێشان وقەرەبووکردنەوەی رابردووی رەش وچەڵکن بە باشترینی کردەوەکان.

سزایەك بۆ ئێستا وسزایەکی زۆر سەختگیر بۆ داهاتوویەکی نزیك: گومانی تێدانییە سەرپێچی وتاوان هۆکارن بۆ نەمانی بەرەکەتی خوایی ودابەزینی سزای جۆراو جۆر ، وە ئەوەی لە ئوممەتانی پێشوو رویدا بریتی بوو لە سزای زوو بەهۆی کوفر وشیرك وبێ باوەڕی وبەردەوام بوونیان لەسەر گوناهـ وتاوان...بەڵام سزای رۆژی دوایی زۆر توندترە وزەبری زۆر زیاترە.

بوەستە وهەرگیز شانازی مەکە: برای بەرێز...خوشکی ئازیز، شانازی مەکە بەو کردەوە کەمەی کە ئەنجامی دەدەی رۆژانە، بەداخەوە، بەشێکی زۆر لەو موسڵمانانەی کە شانازی بە موسڵمانێتی خۆیان دەکەن بەڵام لە هەمان کاتدا هەڵوەستەیان نییە لە بەردەم سنورەکانی خوا کە یەکجار ترسناکە بۆیە بە چاوی سەری خۆمان دەبینین کەوتوونەتە نێو زۆنگاوی تاوان " لە کوفرەوە بگرە تاکو بچوکترین تاوان!" تا گەروو بگرە زیاتریان نقووم بووە لە تاوان...لەگەڵ ئەوەشدا بەردەوامن وناشگەڕێنەوە...بەداخەوە لەگەڵ ئەوەی کەناڵە راگەیاندنەکانی بانگەوازی ئیسلامی زۆربووە بە بیستڕا وبینراو وخوێنراو بەڵام رۆژ لە دوای رۆژ خراپەکاری وتاوان لە پەرەسەندن دایە تاوەکو لەنێو دەزگا چاکەکانیش شلگیریەکی ناتۆکمە بەرچاو دەکەوێ. دڵنیابە هەموو ئەوانە بریتییە لە

---

٢- بەو چیلکە وچاڵەی لافاوە دەڵێن کە هاوردویە وداویەتیە کەنار دەریا ورووبار.

فریودانی شەیتان وهەڵخەڵەتاندنی سەربازانی ئەو، کە هەرگیز بێ تاقەت نابن وکۆڵ نادەن. ڕێ ی بەرەو خواچوونت لێ وون دەکەن یان وا دەکەن زۆر بە کزی ولاوازییەوە ڕێ بکەی یان بەرەو نادڵنیایی بە پاداشت وسزای ڕۆژی دوایی یان ئەوەتا ئومێدی زۆر ودووروودرێژ بوون بە دونیا چاوەکانت تاریك دەکەن ودڵت کوێر دەکەن، ئەندامەکانت سست دەکەن لە خوداپەرستی تا ئەو کاتەی هیواکان بەرەو چاکبوون زۆر لاواز دەبن وریگای رزگاربوون یەکجار تەسك دەبێتەوە.

ڕێگرەکانی بەردەم ڕێگا وبەلای گەورە: قورسترینیان تاوانە، بەجۆرێك "لەبەر چاوی خەڵکەوە وا دیارە" هەندێ کەس دەبینیت زۆر بە گورج وگۆڵی پەرستشەکان ئەنجام دەدەن بەڵام خاوەن دڵێکی بێ ئاگایە دەبێ بزانی دڵ بەرەو خوا دەڕوات نەك جەستە وەك شێخمان ابن القیم دەفەرموێ "قلبه نائم وطرفه یقظان" واتە دڵی نووستووە ولایەکانی بەخەبەرن. هەر بۆیەش هەروەك لە (مدارج السالکین) داهاتووە یەکەم پلە کە بەندە دەیگاتێ بریتییە لە "الیقظة" واتە دڵ خەبەربوون. ئەمەش لەبەر دوو هۆ، یەکەمیان بێ ئاگایی لە ڕۆچوونی لە تاوان وە دووەمیان ئەنجامدانی پەرستشەکان بە جۆرێك دڵ بەشداری ناکات هەروەك شێخمان ابن القیم دەفەرموێ: یەکێك دەبینی لە هەموو کەسێك خواپەرستی زیاترە ونزیکترە لە خوا بەڵام کە دەچێتە بەردەم دادگای خوایی لە هەموو کەسێك دوورترە لە خوا.

کۆت وپێوەندەکان بشکێنە لە تاوانخوازی خۆت بکرەوە: چارەسەر بریتییە لە دەست هەڵگرتن لە هەموو جۆرەکانی تاوان بە گەورە وبچوکی، لە سەرەتا وکۆتایی، ئەوەی بە نهێنی ئەنجام دەدرێت ئەوەشی بە ئاشکرا ئەنجام دەدرێت. هیچی تر خەریکی مەلە نەبیت لە نێو خراپە بەڵکو پێویستە لە رووباری تەوبەو چاکە برێك ڕووناکی وژیان وەربگریت. وە چاککردنی کردەوەکان لە نیەت وبەدوای پێغەمبەر کەوتن. نیەت بە تەزکیەی نەفس چاك وپاك دەبێت کە پێویستی بە کۆششێکی زۆر نەبراوە هەیە[3] ". وە پاشان بە دواکەوتنی پێغەمبەریش بە پابەندبوون بە بەڵگەی قورئانی وفەرموودەی صەحیحی پێغەمبەر ونزیك بوونەوە لە زانایانی خوایی (ربانی) چارەسەر دەبێت

٣- تەزکییەی نەفس یان شارەزابوون لە زانستی دڵ کە بە (العلم العلوم) واتە: زانستی زانستەکان ناسراوە"بەداخەوە زۆربەی خەڵك لێ ی بێئاگایە" پێویستی بە زنجیرەیەك ڕێنمایی مەنهەجی هەیە، ئەگەر خوای گەورە تەمەنی درێژ کردینەوە لەسەر چاکە، لە کاتی خۆی لە زنجیرەیەکی سەربەخۆ پوختەی تەزکیەی نەفس روون دەکەینەوە وخاڵە زۆر وورد وگرنگەکان دەخەینە ڕوو.

چونکە لە هەموو بوارەکانی تریش وەك بیروباوەڕ ومەنهەج وفیقهـ وتەواوی شتەکانی تریش گومڕابووەکان بەهۆی پەیوەست نەبوونیان بە بەڵگە ڕێگەیان وون کرد.

ڕاستی تەوبەکەت بسەلمێنە: تەوبە کردن واجبە بۆ تێکڕای ئیمانداران وئوممەتی ئیسلام، دەبێ موسڵمان دوورکەوێتەوە لە تەوبەی درۆزنانە کە لە ناخیدا نیەتی گەرانەوە بۆ سەر تاوان هەیە یان تەوبەی ڕێوی کە فێڵبازانە تەوبە دەکات. دەبێ موسڵمان ئەوە بزانێت ئەگەر لە کوفر وشرك ڕزگاری بوو چووە نێو بازنەی ئیمان هێشتا ڕزگاری نەبووە چونکە لەم نێوەندەدا شەیتان یاری بە چارەنووسی دەکات لە ڕێگەی جۆراو جۆر گرینگترینیان دووڕوویی ئەویش بیروباوەڕی وکردەیی هەیە یان دەیکاتە ریابازێکی پاڵەوان یاخود کەسێکی شانازی کەر بەجۆرێك زۆر سەرسامە بە کەسایەتی وکردەوە وبیروبۆچوونەکانی خۆی وغەیری خۆشی پێ بچوکە ولە ئاستێکی نزمدا سەیریان دەکات ئەم کردەوەیەش زیاتر لە دڵەوە سەرچاوە دەگرێت نەوەك نیشانی بدات. ئەگەر بەندە لە هەموو ئەوانە ڕزگاری بوو وە لەسەر ئەوەش مرد ئومێدی ئەو کەسەی هەیە کە خۆشی نەبڕاوەی پێ ببەخشرێت.

# مێژوو وپاڵنەری سەرپێچی کردن

ناساندنی سەرپێچی کردنی خوا: بریتییە لە نەکردن و وازهێنانی داخوازییەکی خوا کە بە پێویستی داناوە لەسەر ئیماندار وە یان ئەنجامدانی کارێك کە یاساغ وقەدەغە کراوە. بێگومان داخوازی وقەدەغەکردن واتە هەردووکیان دەبێت بە تاوان وسەرپێچی کردن سەلمێندرا بێت بە بەڵگەی قورئان یان فەرموودەی صەحیح یان کۆڕای زانایانی ئەهلی سوننە وجەماعە، واتە بەهیچ شێوەیەك بە بنچینەی عادات وتەقالید وکەلتوری کۆمەڵگە ناتوانرێت هیچ شتێك بکرێتە داخوازی یان قەدەغە بکرێت. وە ئەنجامدانی داخوازی ئەوەی بە پێویست دانراوە وە خۆپاراستن لە تاوان کە قەدەغەی لێ کراوە دەبێتە هۆی گەیشتنی بەندە بە پلەی تەقوا وە ئەو کەسە دەبێتە خاوەنی پاداشتێکی زۆر وبەختەوەری دونیا ودوارۆژ، دڵیش تەنها بەوە دڵتەنا دەبێت ولە بەلاّلێدراوی دوور دەبێت.

مێژووی سەرپێچی کردنی خوا لـە ئاسمان: ئەو کاتەیە کە خوای پەروەردگار کە فەرمانی بە ئیبلیس کرد کە سوژدە بەرێ بۆ ئادەم ئەویش لـەبەر پاڵـنەری ئیرەیی وخۆبەگەورە زانین سەرپێچی خوای گەورەی کرد. ئەو پاڵـنەرانەش ئێستا لـە مرۆڤدا زۆر بە ڕوونی هەستی پێدەکرێ کە وا لـە مرۆڤ دەکات بەرەو ئازار ودۆزەخێکی نەبڕاوەی ببات. پاشان سەرپێچییەکەی ئادەم وحەوا بوو کاتێك هەردووکیان لـەبەهەشت بوون خوای گەورە فەرمانی پێکردن کە لـەو جۆرە دارە نەخۆن بەڵام پاش ئەوەی ئیبلیس هانی دان وئەوانیش بەهۆی لـەبیرچوونەوە فریویان خوارد فەرمانی خوایان شکاند.

جیاوازییە گەورەکەی نێوان سەرپێچی ئیبلیس وئادەم وحەوا: ئیبلیس کاتێك ڕەتی کردەوە کە سوژدە بەرێ بۆ ئادەم کە خوای گەورە بە دەستەکانی خۆی دروستی کردبوو بە بەهانەی ئەوەی ئەو باشترە لـە ئادەم کە خوای گەورە ئیبلیسی لـە بڵێسەی ئاگر دروست کردووە وە ئادەمیش لـە قوڕ کەواتە ئیبلیس بەوە فریوی خوارد وخۆی بەگەورە زانی لـەسەر ئەوەش پەشیمان نەبوویەوە لـەسەر سەرپێچییەکەی. بەڵام کاتێك ئادەم وحەوا بەهۆی هاندانی ئیبلیس فریویان خوارد وسەرپێچی خوایان کرد بەڵام ڕاستەوخۆ کە هەستیان بەو سەرپێچییە کرد پەشیمان بوونەوە وتەوبەیان کرد خوای گەورەش تەوبەکەی لێوەرگرتن.

وازهێنانی فەرمانێك یان ئەنجام دانی نەهیەك: سەرپێچی ئیبلیس گەورەتر بوو لـە هی ئادەم وحەوا چونکە هەروەك زایانان فەرموویانە "لأن ترك الأمر عند الله أعظم من ارتكاب النهي" هی ئیبلیس بریتی بوو لـە وازهێنان لـە فەرمانی خوای گەورە، بەڵام هی ئادەم وحەوا بریتی بوو لـە ئەنجامدانی نەهییەك. کەواتە بۆ نمونە ئەنجام نەدانی و وازهێنان لـە نوێژ زۆر گەورەترە لـە ئەنجامدانی نەهییەك بۆ نمونە غەیبەت کردن، وە سازدانی هەموو ڕوودۆخێکی ناخۆش دەستی خراپەکاری مرۆڤی تێدایە هەرچەندە بە ویستی خوایە.

کاریگەری سەرپێچی ئادەم وحەوا بۆ سەر نەوەکانیان: لـە فەرموودەی ئیمامی ترمذی هاتووە کە شێخ ئەلبانی بە صەحیحی داناوە ئەویش فەرموودەکەی ئەبو هورەیرەیە کە فەرموودەکە کەمێك درێژە پێغەمبەر ئاماژە بەوە دەکات کاتێك خوای گەورە ئادەمی دروست کرد دەستی نا بە پشتی

ئادەمەوە لەوێدا ئادەم هەموو نەوەکانی خۆی بینی وە لە نێویاندا پیاوێکی بینی پێی سەرسام بوو کە نێوان چاوەکانی سپی بوو، ئادەمیش فەرمووی خوایە ئەوە کێیە؟ خوای گەورەش فەرمووی ئەوە پیاوێکە لە کۆتایی ئوممەتەکان دا دێت ناوی داوده؟ ئادەمیش فەرمووی چەندتت تەمەن پێبەخشیوە؟ خوای گەورە فەرمووی شەست ساڵ. ئادەمیش فەرمووی: خوایە بۆی زیاد بکە چل ساڵ لە تەمەنی من بخەرە سەر تەمەنی ئەو. کاتێك ئادەم تەمەنی تەواو بوو مەلائیکەتی گیان کێشان هاتە لای بۆئەوەی گیانی بکێشێ...ئادەم فەرمووی ئەی هێشتا چل ساڵم نەماوە؟ ئەویش فەرمووی: ئەی تۆ بە نەوەی خۆت داودت نەبەخشی؟ ئینجا پێغەمبەر لە فەرموودەکە دەفەرموێ "فجحد آدم فجحد ذريته، وخطىء آدم وخطىء ذريته" واتە: ئادەم نکوڵی کرد نەوەکانیشی نکوڵی دەکەن، وە ئادەم هەڵەی کرد نەوەکانیشی هەڵە دەکەن.

یەکەم تاوان لەسەر زەوی ئەنجامدرا: بریتی بوو لە ئیرەیی قابیل بۆ هابیل تاوەکو کوشتی، وە هەرچی کوشتن بە ستەم هەیە کە لەسەر زەوی ئەنجامدەدرێت بەشێکی تاوانەکە بۆ قابیلە "ئەوەش بەشێکە لە بەڵا ونەهامەتیەکانی سەرپێچی کردنی خوای گەورە"...هەروەك لە فەرموودەی صەحیحی بوخاری هاتووە کە عبداللەی کوڕی مەسعود فەرموودەکە دەگێڕێتەوە کە دەفەرموێ پێغەمبەر فەرمویەتی "ما من نفس تقتل ظلما إلا كان على ابن آدم الأول كفلُ منها، ذلك بأنه أول من سن القتل"...هەندێك کەس تاوانەکانی وا بەرە بەرە کەتە دەبن بەسەر شانییەوە بەبێ ئەوەی هەستی پێبکات.

پاڵنەر وهۆکارەکانی سەرپێچی کردنی خوای گەورە: شێخی پایەبەرز ابن القيم لە پەرتوکە بەنرخەکەیدا "الفوائد" دابەشی دەکات بۆ سێ پاڵنەری سەرەکی: پەیوەست بوونی دڵ بە غەیری خوا کە دەبێتە هۆی هاوبەش بڕیاردان بۆ خوای گەورە...گوێڕایەڵی کردنی هێزی تووڕەبوون کە دەبێتە هۆی ستەم کردن...گوێڕایەڵی کردنی هێزی ئارەزووبازی ئەویش دەبێتە هۆی فاحشەکردن، واتە: بەکارهێنانی داوێن بەناشەرعی. ئامانج ومەبەستی پەیوەست بوونی دڵ بە غەیری خوا بریتییە لە هاوبەش دانان بۆ خوای گەورە کە لەپاڵ خوای گەورە زاتێك وشتێکی تر بپەرستیت لە گوێڕایەڵی کردن وخۆشەویستندا. ئامانج ومەبەستی هێزی تووڕەبوون کوشتنە بە ستەم...ئامانج ومەبەستی هێزی ئارەزووبازی زینایە. دوورکەوتنەوە لە هەرسێکیان بەشێکی زۆر گرنگن لەو سیفاتانەی کە خوای گەورە بە بەندەکانی خوا ناوی بردوون هەروەك لە سورەتی فورقان هەروەك

خوا دەفەرموێ "والذين لا يدعون مع الله الها آخر ولا يقتلون النفس التى حرم الله الا بالحق ولا يزنون ومن يفعل ذلك يلق أثاما"

سێ تاوانی بەیەکەوە گرێدراو وکەوتنە واقعێکی زۆر تاڵ: مامۆستای پەروەردەییمان[4] ابن القيم "قوتابییە زۆر بلیمەت وبەتواناکەی شيخ الإسلام ابن تيميه" درێژە بە ووتە زۆر بەنرخەکەی دەدات وئاماژە بەوە دەکات کە ئەم سێ تاوانە هانی یەکتر دەدەن ویەکتر رادەکێشن، هەروەك هاوبەش دانان خەڵکی هان دەدا بەرەو ستەم وخراپەکاری وفاحیشە، ئاوا یەکتاپەرستی ونیازپاکیش هەر سێ رەگەکەی سەرپێچی لە خاوەنەکەی دووردەخەنەوە. ئەوەشی ئەمرۆ وە بەدرێژایی مێژووی شکستی موسڵمانان دەیبینین هۆیە بنەڕەتییەکەی بریتییە لە گیرۆدەبوونی موسڵمانان بەم سێ جۆرە تاوانانە، وە هەرگیز مرازی ئیمانداران حاصل نابێت وناگەرێنەوە ژێر هەمان شکۆی پێشویان وە هەردەم ژێر دەستەی ئەم وئەم دەبن وە بەبەردەوامی گەردەنیان لە ژێر دەست وچنگی بێ باوەڕەکان دەبێت کە هیچ جۆرە بەزەیی ونەرمییەك بەرامبەریان نانوێنن، لێرەشدا تەنها یەك رێگای دەرچوون هەیە ئەویش دەست بەرداربوون لە هەر سێ سەرپێچییەکە بەتەواوەتی...بەتایبەتی لەم سەردەمەدا هەرسێ تاوان ئەگەر مرۆڤی ئیماندار تاوەکو خۆی زۆر قایم نەکات بە زانستێکی زۆر دروست وکارکردن بەو زانستە دەکەوێتە چاڵێکی زۆر قوڵەوە.

---

٤- لەسەردەمی بڵاوبونەوە وسەرسام بوونی بەشێك لە ئوممەتی ئیسلامی بە فەلسەفە رۆژئاواییەکان، لێرەدا زۆر گرنگە مرۆڤی ئیماندار شارەزاییەکی زۆری لە پەرتوکەکانی ابن القيم هەبێت کە مێژووی ئیسلامی کەم زانای وای بەخۆیەوە بینیوە کە لە زانا زۆر گەورە وعیملاقەکانە. وە ئەگەر خوای پەروەردگار تەمەنی پێداین ودەرفەت گونجا زنجیرە ووتارێکی پوخت دەنوسین سەبارەت بە چەمکی پەروەردە لەلای ابن القيم.

# شوێنەواری تاوان لەسەر ئوممەتانی پێشوو

## پێغەمبەر یوسف ودوانزە براكەی بە نمونە

پێغەمبەر یوسف "سەلامی خوای لێ بێت": لە پەرتوكی "الزهد"ی ئیمامی ئەحمەد فەرموودەیەك هاتووە كە الحسن دەفەرموێ پێغەمبەر فەرمویەتی "رحم الله یوسف لولا كلمته ما لبث في السجن طول ما لبث، قوله (أذكرني عند ربك)" واتە: رەحمەتی خوا لە یوسف بێت ئەگەر ئەو ووشەیەی نەوتبایە ئەوا ئەوەندە لە زیندان نەدەمایەوە كە لە زیندان مایەوە، ئەویش كاتێ فەرموی(لای گەورەكەت باسم بكە)" پاشان الحسن گریا وفەرموی "ونحن اذا نزل بنا أمر فزعنا الى الناس" واتە: ئەی ئێمە كاتێك تووشی بەڵایەك بوینایە پەنامان دەبردە لای خەڵك. لەسەر ئەم باسە شیخ الإسلام ابن تیمیە لە "الفتاوی" بەرگی (١٥) دەفەرموێ "لیس في قوله: (أذكرني عند ربك) ما يناقض التوكل، بل قد قال يوسف: (إن الحكم الا لله)، و قوله (أذكرني عند ربك) مثل قوله (اجعلني على خزائن الأرض إني حفيظ عليم) فلما سأل الولاية للمصلحة الدينية لم يكن هذا تناقضا للتوكل و لا هو من سؤال الإمارة المنهي عنه وليس فيه الا مجرد أخبار الملك به ليعلم حاله ليتبين الحق، وكان يوسف من أثبت الناس" واتە: كاتێك یوسف فەرمووی "لەلای گەورەكەت باسم بكە" بەهیچ شێوەیەك پێچەوانەی پشت بەستن نەبوو بە خوای گەورە، بەڵكو بەراستی یوسف فەرموی "هەموو حوكم وبڕیارێك تەنها بۆ خوایە"، هەروەها كاتێك فەرمووی "لەلای گەورەكە وپادشاكەت باسم بكە (كە بەناهەق گیراوم)" وەكو ئەوە وایە كە فەرمووی "لەسەر خەزنە ودارایی میصرم دابنێ چونكە بەڕاستی من دەست پاك وشارەزا وزانامە" كاتێك داوای كاربەدەستی كرد بۆ بەرژەوەندی دینی بوو وە ئەوە هەرگیز تێك ناگیرێت لەگەڵ پشت بەستان بەخوا وە ئەو جۆرە داواكاردنەی بۆ بوونە كاربەدەست رێگەی پێنەگیراوە، وە ئەوە تەنها پێڕاگەیاندنی پاشای میصرە كە حاڵی ئەو بزانێت وهەق روون بێتەوە، وە لەڕاستیدا یوسف لە جێگیرترین كەس بوو لەسەر دین.

"بەنی ئیسرائیل" لە نەوەی یانزە براكەی یوسفن: چیرۆكی پێغەمبەر یوسف زۆر بە دووروودرێژی لە قورئان باسكراوە، بەڵام دەبێ بزانین ئەو یانزە برایەی یوسف هەر تاوانێكیان كردبێت ئەوا رەنگدانەوەی ئەم تاوانە لەسەر نەوەكانی دوای خۆیان بەدیاركەوتووە، هەروەك كاتێك گوتیان "أحب الى ابينا منا" واتە: یوسف وبراكەی زۆر خۆشەویستر ودڵخوازترن لە ئێمە لەلای

باوكمانەوە، لەبەرئەوەی ئەوان ئیرەییان برد بە یوسف، ئیرەییان لێ پەیدابوو وە ئەوەش بۆ نەوەكانی دوای خۆیان چوو. یان كاتێك كە ووتیان "إن یسرق فقد سرق أخ له من قبل" واتە: ئەگەر (بنیامین) دزی كردبێ ئەوە بەدڵنیاییی پێشتر براكەی دزی كردووە (واتە: یوسفیش دز بووە). درۆهەڵبەستان ودرۆیان لێ پەیدابوو وە ئەوەش بۆ نەوەكانی دوای خۆیان چوو. یان كاتێك گوتیان "أقتلوا یوسف" واتە: یوسف بكوژن. ئەوەش لە نەگبەتی تاوانە كە كاتێك سوربوون لەسەر بەدەست هێنانی بەرژەوەندی وجێ بەجێكردنی پیلانەكانی خۆیان هەموو ڕێگایەك دەگرنە بەر ئەگەر كوشتنیش بێت، وە ئەوەش پاشان بۆ نەوەكانی دوای خۆیان ڕۆیشت. یان كاتێك گوتیان "ونحفظ أخانا ونزداد كیل بعیر" واتە: براكەشمان دەپارێزین وباری ووشترێكیش (دانەوێڵە) زیاد دەهێنین. هەر لێرەوە خۆشویستنی ماڵ وسامان پەیدابوو، پاشان ئەوەش بۆ نەوەكانی دوای خۆیان گوازرایەوە، بەنی ئیسرائیل كە لە میصر نیشتەجێ بوون، وە لە ژێر چەپۆكی حوكمی فیرعەون ژیانییان بەسەردەبرد، فیرعەونیش سەخت ورەقی خستبووە گەڕ بەرامبەریان، تام وچێژی ژێردەستەیی وسوكیان كردبوو لە ژێر دەستی فیرعەون، بەجۆرێك فیرعەون ودەسەلاتەكەی كوڕانی ئەوانی دەكوشتن وژنەكانیشی بەزیندوویی دەهێشتەوە (دەیكردنە خزمەتكار وكەنیزەك). پاشان خوای گەورە پێغەمبەر موسای بۆ ڕەوانەكردن بۆئەوەی لە قوڕ ولیتەی زەلیلی وژێردەستەیی دەریان بێنێ، وە بۆئەوەی بەنی ئیسرائیل سوپاسگوزاربن. هەروەها چیرۆكێكی ڕێزگرتنی بەنی ئیسرائیل، هەروەك خوا دەفەرموێ "یا بني اسرائیل أذكروا نعمتي الذی أنعمت علیكم وأني فضلتكم علی العالمین" واتە: ئەی بەنی ئیسرائیل (نەوەكانی یەعقوب) یادی ئەو بەخشش ونیعمەتانە بكەنەوە كە بەسەر ئێوەمدا ڕشتوە، وە من (كاتی خۆی) فەزڵ ڕێزی ئێوەمدا بەسەر هەموو جیهان. ئەم ڕێز وفەزڵانەش بریتییە لە ناردنی پێغەمبەران، بەخشینی نیمەتی زۆر وخنكاندنی فیرعەون ودار ودەستەكەی لە دەریا كاتێك بەناو دەریاكە تێپەڕین، بەلاّم لەگەڵ ئەو هەموو ڕێزە زۆر وزەوەندە زێڕ وماڵی میصریەكانیان دزی لەبەر زۆر خۆشویستنیان بۆ ماڵ. وە لەوەش كارەساتی گەورەتر وخراپتر ئەوەبوو كاتێك پێغەمبەر موسی وبەنی ئیسرائیل پەڕینەوە لە دەریا، موسی چووە لای خوای گەورە بۆ ماوەی سی ڕۆژ پاشان دە ڕۆژی تریش هاتە سەر واتە بووە چل ڕۆژ، بەنی ئیسرائیل گوێرەكەیەكییان لە زێڕ دروست كرد ودەیانپەرست. بەوەش قین وتوڕەبوونی خوای گەورە هاتە سەریان "جگە لە ئیماندارەكان نەبێت" تا ڕۆژی دوایی بەهۆی تاوانەكەیانەوە، هەروەك خواش دەفەرموێ "وأشربوا فی قلوبهم العجل بكفرهم" واتە: دڵیان

ئاودرابوو بە خۆشەویستی گوێرەکەکە بەهۆی بێبڕواییانەوە. هەر لەوکاتەی کە بەنی ئیسرائیل گوێرەکەکەیان لە زێڕ دروست کرد تاوەکو ئێستاش جولەکەکان زۆر حەز بە کۆکردنەوەی زێڕ دەکەن. وە هەندێ سیفاتی تریان بریتییە لە کەللەڕەقی وسەرکەشی وپێچەوانەکردنی پێغەمبەرانیان. وە کاتێك خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردن کە لە شاری "بيت المقدس" نیشتەجێ بن وە لە خواردنەکانی ئەوێ بخۆن لە هەر لایەك حەزتان کرد بەڵام کاتێك کە لە دەرگا چوونە ژوورەوە بڵێن "حطة" واتە: داوای ئێمە سڕینەوەی گوناهەکانمانە، بۆئەوەی لە تاوانەکانییان خۆشبێت وتەوبە وپەشیمانییان لێ وەربگرێت، هەروەك خوا دەفەرموێ "فبدل اللذين ظلموا منهم قولا غير الذى قيل لهم"واتە: کەچی ئەوانەی ستەمییان کرد ئەو ووتەیەی کە پێیان ووترابوو گۆڕییان بە ووتەیەکی تر. بۆیەش ئەوان بە گاڵتەجارییەوە دەیانگوت: حنطة، حنطة واتە: گەنم، گەنم! وە چیرۆکی مانگایەکە کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردن مانگایەك سەرببڕن بەڵام بەهۆی قسە وپرسیاری زۆرەوە خوای پەروەردگار داواکاری جۆری مانگایەکەی لەسەر سەخت کردن، هەربۆیە ئەو سیفەتەش پاشان بۆ نەوەکانی دوای خۆیان گوێزرایەوە. وە چیرۆکی "اصحاب السبت" کە خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردن لە ڕۆژانی شەممە ڕاوە ماسی نەکەن ئەوانیش بەهۆی بەکارهێنانی فڕوفێڵەوە ئەم کارەیان ئەنجامدا خوای پەروەردگار لە سزا وتۆڵەی ئەو تاوان وسەرپێچییە ئەوانی کردە مەیمون وبەراز. وە چیرۆکی خۆراکی بەهەشت "المن والسلوى" واتە: گەزۆ وباڵندەی شێلاقە، کە نەفسی مرۆڤ لە خواردنی بێزار نابێت. بەڵام کاتێك بەنی ئیسرائیل بەو شێوەی کە خوویان پێوەگرتبوو لە سەرکەش بوون بەرامبەر فەرمانی خوای گەورە، داوایان لە پێغەمبەر موسی کرد کە خۆراکی زەویان پێبدا لە تەرۆزی وسیر ونیسك وپیاز کەواتە گۆڕییانەوە بە خراپتر لەوەی پێشوو وە کاتێك ئەوان لە زەوی سینا بوون بەڵام بەهۆی سەرپێچی وتاوان خوای پەروەردگار ئەوانی دابەزاند ونیشتەجێی کردن لە شارێك لە شارەکانی "فەلەستین" وە لەوێدا هەژاری وریسوایی درا بەسەریاندا، وە خەشم وقینی خوایان بۆ خۆیان هێناوە کە تاوەکو ڕۆژی دوایی هیدایەت وەرناگرن. وە خوای پەروەردگار فەرمانی پێکردن کە خۆراك هەڵنەگرن "ئەوکات ئەگەر خۆراك بۆ ماوەیەکی زۆریش بمابایەوە ئەوە تێك نەدەچوو وبۆگەنی نەدەبووا!" بەڵام بەهۆی ئەو سەرکەشییەی بەنی ئیسرائیل کە خوویان پێوەگرتبوو پێچەوانەی فەرمانی خوایان کرد، لەو ڕۆژەوە خۆراك تێك دەچێت ئەگەر بۆماوەیەك بمێنێتەوە! ئەمەش ناتوانرێ بەڵگە بهێنرێتەوە بە ئامێرە ساردکەرەوەکان بۆ پاراستنی خۆراك وەك بەفرگر وهاوشێوەکانی! چونکە مێژووی دروست

بوونی میکرۆب لەو کاتەوە دەستی پێکرد کە لە هەوا بلاوبێتەوە ومەلە بکات پاشان کاربکاتە سەر خۆراك بۆگەنی بکات. هەروەك لە فەرموودەیەك هاتووە لە "مختصر صحيح مسلم" کە هی ئیمامی "منذری" یە وە شێخ ئەلبانی تەحقیقی فەرموودەکانی کردووە، ئەبو هریرە دەفەرموێ پێغەمبەر فەرمویەتی "لولا بني اسرائيل لم يخبث الطعام ولم يخنز اللحم" واتە: ئەگەر بەنی ئیسرائیل نەبوایە خواردن تێك نەدەچوو وگۆشتیش بۆگەنی نەدەبوو.

# بەلا و ناهامەتی تاوان لەسەر ئوممەتانی پێشوو

تاوان وەك بەلا بۆ سەر فیرعەون وخانەوەداکەی ودەست وپێوەندەکانی: فیرعەون کاتێك لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی بوو زۆر خۆی بادەدا ویەکجار سەرکەش ولوتبەرزبوو. ببوە کەسێك کە باری چەندین جۆری تاوان لە کۆڵیا هەڵگرتبوو وە بە چەندین تاوانی جۆراوجۆر سەری خۆی گەرم کردبۆوە، دواجاریش ئەم سەرپێچی وسەرسەختی وکەللە ڕەقییە سەری فیرعەون ودەست وپێوەندەکەی خوارد وهەموو حەزە شێتانی وخەونە بێ سەر وبنەکانی بەیەکجاری سەرونگوم بوون! کەواتە ئەوەی هاوڕێشتە وتاوان ئەنجام دەدات یان دەبێ بەرەو چاکی ببەیت یان دەبێ وازی لێبێنی وهیچی تر هاوڕێیەتی نەکەیت چونکە گەر وانەکەی قوربەسەرییەکە تۆش دەگرێتەوە بە هەمان سزا جا ئەوە حیزب یان تاك بێت! بۆیەش فیرعەون وپاسەوانی حکومەتەکەی فیرعەونیش هەر لە دونیا بە نەفرەت بوون "وحاق بآل فرعون سوء العذاب" واتە: سزای سەخت هات وداروودەستەی فیرعەونی گرتەوە. هەتا گەنجینەکەی بێ بەش نەبوو لەم نەفرینە وە ئەوەشی دەستی بۆ دەبات تووشی بەدبەختی وبەلای ئەم نەفرینە بوو، بێ گومان ئەم نەفرینەش نەفرینی خوایی بوو هەروەك دەفەرموێ "وأتبعناهم في هذه الدنيا لعنة ويوم القيامة هم من المقبوحين" واتە: لەم دونیایەدا نەفرینمان نارد بەدوایاندا وە لەرۆژی قیامەتیشدا ئەوانە لە بێزراو ودوورخراوەکانن. نەوەك ئەوەی کە زانایانی شوێنەوار بانگەشەی بۆ دەکەن گوایە فیرعەون جادووی داناوە لەسەر ماڵ وسامان وگەنجینەکانی، هەر کەسێك دەست بۆ ئەو موڵك وسامان وگەنجینەی فیرعەون ببات تووشی نەفرینی فیرعەون دەبێت! وە لە نووسینە هیرۆغلۆفییەکانیش هاتووە کە هەر کەسێك دەست بۆ موڵك وسامانە زۆر وزەوەندەکەی فیرعەون ببات تووشی نەفرەتی خوا دەبێت "خوا پەنامان بدات".

ئێستا ئەم گەنجینانە ناسراون بە "نەفرینی فیرعەونەکان!". بەڵام بۆ دوارِۆژیش خوای پەروەردگار پەردە لەسەر ئاکامی فیرعەون وداروودەستەکەی لادەبات بە سروشی خۆی هەروەك دەفەرموێ "النار يعرضون عليها غدوا وعشيا ويوم تقوم الساعة أدخلوا آل فرعون أشد العذاب" واتە: بەیانییان وئێواران فیرعەون ودەست وپێوەندەکەی دەبرێنە دیار ئاگری دۆزەخ، وە ئەو رۆژەش کە قیامەت هەڵدەستێت (فەرمان دەدرێ) کە داروودەستەی فیرعەون بخەنە سەختترین سزاوە.

شوێنەواری تاوان لەسەر گەلی پێغەمبەر صالح وشوعەیب وهود ونوح ولوط: گەلی هەموو ئەم پێغەمبەرانە هەریەکەو بە شێوازێك لەناوچوون...هەندێکیان بە دەنگێکی بەهێز، هەندێکی تریان بە لافاو، وە هەندێکیان بە بایەکی بەهێز، وە هەندێکی تریان بە بارینی بەرد لە ئاسمانەوە. لە بەڵا ونەهامەتییەکانی تاوان ئەوە بوو کە کەس لە شوێن ئەوان نیشتەجێ نەبووە وناشبێت، وە ئاوی بیرەکانیان ناخورێتەوە، هەروەها لەناوچوونی زانست وزانیارەییەکانیان لە هونەری داتشینی خانوو لە شاخ وچیاکان وە وون بوونی ناسینی شوێنی ئاو وکانزاکان، ئەوەی لەسەر ئەم باسەش زانراوە ئەوەیە کە ئێستا بە شێوە زانستییەکەی "شەپۆلی خۆیەتی" وە پێی دەوترێت "گۆچانی کەشفکەر" کە رێنیشاندەرە بۆ دۆزینەوەی شوێنی ئاو وکانزاکان وداتاشین لە رێگەی موگناتیسی زەوی بەهۆی شێوەی ئەندازەیی، ئەم زانستە تاکو ئێستاش نادیارە، ئەم زانستە ئێستاشی لەگەڵ دا بێت بە نادیاری مایەوە کە تەنها لە چەند بوارێکی زۆر تەسك نەبێت...تاوان خاوەن ئەو هۆکارەیە کە لە کۆن وتازەشدا بۆتە داینەمۆ وبزوێنەری شەپۆلە وێرانکەرەکان کە زۆر جار کاڵ فامەکان بە هۆکاری ماددی پێناسەی دەکەن لەکاتێکدا نهێنی زۆر ووردی پشت هۆکارەکانیان لێوە دیار نییە کە بە چەمکی نەهجی قورئان وفەرموودە بە تاوان وسەرپێچی ناونووس کراوە، ئەم بنەمایە گەردوونیە خواییە لە رابردوو وئێستا ولەداهاتووشدا زۆر کاریگەرە ودەگاتە سەرەنجامی خۆی بێ هیچ جۆرە دواکەوتنێك وکەم وکورییەك، کەواتە پاش ئەوەی تاوانت ئەنجامدا لێی کرِمەکەوە چونکە دڵنیابە بەڵاهێنەرە بەڵکو سوژدەبەرە وپەشیمان بەوە، پاشانیش کردەوەیەکی چاك لە دوای ئەنجام بدە. ئەو زانست وتوانایەش کە خوای پەروەردگار بە هەر گەلێکی بەخشیبێت ئەوە بەوە تاقی کردونەتەوە، وە ئەو کەسانەی ویستوویانە بەرامبەری بکەن بەرامبەر ئەم هەقە ئەوا خوای پەروەردگار موعجیزەیەکی بەخشیوە بە پێغەمبەرەکەی خۆی بەهەمان شێواز، بە واتایەکی تر خوای پەروەردگار هەمان چەکی بەکارهێناوە بۆ سەلماندنی هەقەکەی خۆی کە بێ باوەڕ وئەوانەش گومانیان هەیە لە راستی پەیامی پێغەمبەران. بۆ نموونە لە سەردەمی پێغەمبەر موسی گۆچانی

کەشفکەریان داهێنا وجادوو وسیحریان پێئەنجام دەدا، هەروەك لە چیرۆکی پێغەمبەر موسی هاتووە، خوای پەروەردگار دەفەرموێ "فألقوا حبالهم وعصيهم" واتە: جادوگەرەکان گوریس حەبل وداردەستکانیان فرێدا. هەربۆیە خوای گەورە گۆچانی بە موسی "عليه السلام" بەخشی کە دەگۆڕا بۆ مار وئەژدیهایەکی راستەقینە، وە کاتێك هەڵاتن لە ستەمی فیرعەون وئەکات فیرعەون وسوپایەکی یەکجار زۆر بەدوای پێغەمبەر موسی ویاوەرە ئیماندارەکان لە بەنی ئیسرائیل بوون خوای پەروەردگار بەهۆی گۆچانەکەی موسی دەریای پێ ووشك کرد بە ئیزنی خۆی بۆئەوەی لە دەستی ستەم وزۆرداری فیرعەون رزگاریان بێت! وە لەسەردەمی پێغەمبەر عیسی زانستی پزیشکی پێشکەوتوو بوو، بۆیە موعجیزەی گەورەمان عیسی بریتی بوو لە زیندووکردنەوەی مردوو وچاك کردنەوەی چاوی کوێر وبەڵەك بە رێپێدانی خوای گەورە! گەلی صالح بەتوانابوون لە هونەری داتاشینی چیا ودروست کردنی پەیکەر، بۆیە خوای پەروەردگار پێغەمبەر صالحی بۆ رەوانەکردن کە ئەو موعجیزەیەی پێبەخشی کە حوشترێك لە شاخ هاتەدەرەوە! وە سەردەمی پێغەمبەرمان موحەممەد خەڵکی عەرەب بەتایبەت قورەیشی مەککە لە نووسینی هۆنراوە ورەوانبێژی دەستێکی باڵایان هەبوو، هەربۆیەش قورئان بە رەوانبێژیەکی زۆر بەرز وباڵا هاتە مەیدان تا کۆتایی دونیاش بەرامبەری هەموو کەسێك دەکات، وە پەیامی قورئان پڕە لە ئاماژەی زۆر سەرسوڕهێنەر کە ئەمڕۆ لە فەزای زانستی پێشکەوتوو پرشنگی قورئان زیاتر دەگەشێتەوە، وە دوژمنانیشی سەرشۆڕ وریسوا دەکات.

ئەو کاتەی خانوو دەبێتە گۆڕستان: گەلانی پێشووی ستەمکار بەهۆی تاوانی کوفر وسەرپێچی خوا بەوە رانەگەیشتن کە هەریەکە کاتی خۆی بمرێت وببێتە خاوەن گۆڕی خۆی، نەخێر هەموویان کاتێك لە ماڵ وخانووی خۆیان بوون ئەو کاتەش سزا هات ماڵەکانی خۆیان کە جێگای حەسانەوە بوو، بووە گۆڕستانێکی خامۆش! ئەوە توانج پۆشی نییە کە دوو واتای هەبێت! بەڵکو یەك واتای راست ورەوانی هەیە، یان نەوەك وەك شوێنەوارناس وکلکەکانییان پێیان وایە کە خۆیان گۆڕیان بۆ خۆیان دروست کردووە وشوێنی شاردنەوەیان خۆیان دایانتاشیوە، هەروەك خوای پەروەردگاریش ئەوە بۆ وێناکردووین ودەفەرموێ "فتلك بيوتهم خاوية بما ظلموا ان في ذلك للآيات لقوم يعلمون" واتە: ئەوجا ئەوە خانووەکانیانە کە چۆڵە بەهۆی ئەوەی ستەمیان کرد، وە بەراستی لەم چیرۆکە پەند وئامۆژگاری وبەڵگە هەیە بۆ گەلێك کە دەزانن (چیمان بەسەر ئەواندا هێناوە).

نهێنی سزادانی بەردەوام وهەتا هەتایی کافر وهاوبەش دانەرەکان: لەو کاتەی مرۆڤی بێ باوەڕ دەکەوێتە گیانەڵا یان کاتێك لە ناوەڕاستی دۆزەخ سزادەدرێن...لە هەردوو باردا داوای گەڕانەوە دەکەن بۆ ژیانی دونیا، بۆ ئەوەی ئەمجارە باوەڕ بهێنێ بە پەرستنی یەك خودا وشوێن کەوتنی قورئان وسوننەت وە کردەوەی چاك ئەنجام بدات، بەڵام ئەمە لای خوای گەورە بە هەموو شێوەیەك ڕەت کراوەیە وجێگای قەبوڵ نییە! چونکە پێشتر ئاگادارکرابۆوە لەو سزایە ولە کتوپڕی هاتنی مردن، وە پاشان خوای پەروەردگار ئەوە رادەگەیەنێ کە ئەگەر مۆڵەتیش بدرێن ئەوا دەگەڕێنەوە سەر هەمان کوفر وبێباوەڕی وهەموو ئەو شتانەی کە قەدەغەکراون دووبارە ئەنجامی دەدەنەوە، وە خوای گەورە دەفەرموێ ئەوانە لە راستیدا درۆ دەکەن! هەروەك فەرموویەتی "ولو ترى اذ وقفوا على النار فقالوا يا ليتنا نرد ولا نكذب بآيات ربنا ونكون من المؤمنين (٢٧) بل بدا لهم ما كانوا يخفون من قبل ولو ردوا لعادوا لما نهوا عنه وإنهم لكاذبون(٢٨)" واتە: وە ئەگەر بیانبینیت کاتێك کە لەسەر لێواری دۆزەخ وەستێنراون "یان کاتێك دەخرێنە ناو دۆزەخەوە هەروەك لە پەرتوکی معاني القران هاتووە، وقفوا: أدخلوا" کە دەڵێن خۆزگە دەگەڕێنراینەوە بۆ دونیا وبەڵگەکانی پەروەردگارمان بە درۆ نەدەزانی وە لە بڕواداران دەبووین (٢٧) (نەخێر ئەوانە راست ناکەن) بەڵکو ئەوەی لەمەوپێش دەیانشاردەوە بۆیان دەرکەوتووە، وە ئەگەر بگەڕێندرێنەوە بۆ دونیا بێگومان دووبارە دەگەڕێنەوە بۆ ئەوکارانەی کە لێیان قەدەغەکرابوو، وە بەڕاستی ئەوانە درۆزنن. کەواتە دواجار دەبنە خۆراك وسوتەمەنی دۆزەخ بۆ هەتا هەتایی "سلم يا رب سلم!". کەواتە بەهۆی تاوانی بەردەوام دڵ بەجۆرێك پەردەی لەسەر دروست بووە ورەق بووە هیچ جۆرێك خێر وچاکەی پێوە نەماوە بۆ گەڕانەوە وپەشیمان بوونەوە وفرمێسك هەڵڕشتن بەڵکو تەنها بۆ دۆزەخ شایستەیە.

پەیوەندی وکاریگەری تاوان لەسەر دڵ: کاتی ئەوە هاتووە کە رووپێوێکی وورد بکەین بۆ تاوانەکانمان ودانییان پێدابنێین، پاشانیش ترسناکی شوێنەواری تاوان لەسەر دڵ بزانین کە شوێنی گرنگی بینینی خوای گەورە تەنها دڵە. ئەمە لە فەرموودەیەکی پێغەمبەر زۆر روون دەبێتەوە هەروەك حوزەیفە ئەم فەرموودەمان بۆ دەگێڕێتەوە کە فەرموودەکە صەحیحە وئیمامی موسلیم لە بەشی ئیمان وئیمامی ئەحمەدیش لە موسنەدەکەی هێناویەتی "تعرض الفتن على القلوب كالحصير عوداً عوداً، فأي قلب أُشربها نُكِتَتْ فيه نكتة سوداء، وأي قلب أنكرها نكتت فيه نكتة بيضاء، حتى يصير على قلبين: بمثل الصَّفا فلا تضره فتنة مادامت السموات والأرض، والآخر أسود مِرْباداً كالكوز

مجخيّاً لا يعرف معروفاً ولا ينكر منكراً الاّ ما أشرب من هواه" واتە: فیتنەکان داو داو شوێنەوار لەسەر دڵ پەیدا دەکەن، وەك ئەو رایەخەی کە داوەکانی لەسەر یەك رایەڵ ئەکرێن، جا هەر دڵێك ئەو فیتنەیەی بەرکەوێت ئەوە خاڵێکی رەش لەسەر دڵی پەیدا دەبێت، وە هەر کەسێکیش ئەو فیتنەیەی لەخۆدوورگرت خاڵێکی سپی لەسەر دڵی دروست دەبێت، تا ئەو کاتەی دڵەکان دەبنە دوو جۆر، سپی وەك کێوی صەفا کە هیچ فیتنەیەك زیانی پێناگەیەنێ تا ئاسمان وزەوی مابن. ئەویتریان رەش وەك ئەو تەنییەی بنمیچی مەنجەڵ، یان وەك ئەو گۆز سەرەونخونەی لێدێت، کە هیچ شتێك بەخۆوە ناگرێت، کاتێك ئەو دڵەش حاڵی وابوو بەهیچ شێوەیەك نە چاکە دەناسێتەوە ونە خراپەش بە خراپە دەزانێت تەنها ئەوە دەناسێ ودەزانێ کە هەوا وئارەزووی داوای دەکەن.

تێبینی/ ئەم بابەتە بە ئیزنی خودا لە داهاتوودا درێژەی دەبێت، رەهەندە زۆر گرنگەکانی تایبەت بە تاوان بە تێڕوانینێکی مەنهەجی بە ووردی تیشکی دەخرێتە سەر، بۆئەوەی ببێتە پارێزەرەرێکی گەورە وکاریگەر لە زیانە چاوەڕوانکراوەکان لەپێناو ژیانێکی راستەقینە.

## وصلی اللّه وسلم علی نبینا محمد وعلی آله صحبة وسلم

**لە دوعای خێر بێبەشمان مەکەن**

